# نامەی
# پێشەوا سعید بن جبیر
# (٩٥هـ) رحمه الله

وەرگێڕانی : شاب السني

# ناساندنی خاوەنی نامە

ناوی: سعيد بن جبير بن هشام الأسدي الوالبي مولاهم الكوفي.

نازناوی: أبو محمد.

وەفاتی: ٩٥ هیجریی.

وەصفەکان لەسەری:

- جعفر بن أبي المغيرة دەڵێت: ابن عباس کاتێک ئەهلی کوفە بهاتنایە بۆلای داوای فەتوایان لێ بکردایە، دەیفەرموو: ئایا ابن أم الدهماء تان تیا نیە؟ واتە: سعيد بن جبير.
- لە عمرو بن ميمون ەوە، لە باوکیەوە، دەڵێت: سعيد بن جبير مرد، وە لەسەر ڕووی زەوی کەسێک نەبوو ئیللا پێویستی بە زانستەکەی بوو.
- أشعث بن إسحاق دەڵێت: دەوترا: سعيد بن جبير شارەزاترینی زانایانە.

سەرچاوەی ژیاننامەکەی:

- السير (٣٢١/٤)

سەرچاوەی نامەکەی:

ئەم نامەیە دەرهێنراوە لە کتێبی (تعظيم القدر الصلاة) ی محمد بن نصر المروزي.



عبدالملك بن مروان نامەیەکی ناردووە بۆ سعيد بن جبير هەندێک پرسیاری لێ کردووە، وەڵامی داوەتەوە:

١- پرسیاری کرد دەربارەی باوەڕ [الإيمان] ؟

باوەڕ: بەڕاستخستنەوەیە، بەڕاستخستنەوەی بەندەیە بۆ اللّه، وە فریشتەکانی، وە ئەوەی دایبەزاندووە لە کیتاب، وە ئەوەی نێردراوەکەی پێوە ناردووە، وە بە ڕۆژی دوایی.

٢- وە پرسیار دەکات دەربارەی بەڕاستخستنەوە [التصديق] ؟

بەڕاستخستنەوە: کارکردنی بەندە بەوەی قورئان بەڕاستی خستووەتەوە، وە لاواز و کەمتەرخەم بێت لە شتێکدا، دەزانێت تاوانە و داوای لێخۆشبوون دەکات و دەگەڕێتەوە، وە نکۆڵی ناکات لەسەری، ئەمە بەڕاستخستنەوەیە.

٣- وە پرسیار دەکات دەربارەی دین؟

دین: پەرستنە، پیاوێک لە ئەهلی دینێک نادۆزیتەوە کە واز لە پەرستشی ئەهلی دینەکەی بهێنێت و دواتر نەچێتە ناو دینێکی ترەوە تەنها ئەوە نەبێت کە هیچ دینێکی نیە.

٤- وه پرسیار دەكات دەربارەی پەرستن [العبادة] ؟

پەرستن: بریتیه له گوێڕایەڵی، وه هەركەس گوێڕایەڵی الله بكات لەوەی فەرمانی پێكردووه و لەوەی ڕێگری لێكردووه، ئەوه بەتەواوی الله ی پەرستووه، هەركەس گوێڕایەڵی شەیطان بكات له دین و كرداری، ئەوه شەیطانی پەرستووه، ئایا نابینیت الله دەفەرموێت بەوانەی تێپەڕیون له سنور، ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ﴾ [يس:٦٠].

بەڵكو پەرستنیان بۆ شەیطان: ئەوان شوێنی كەوتوون له دینەكەیاندا، تیایاندایه فەرمانی پێكراوه بت یان خۆر یان مانگ یان مرۆڤ یان فریشتەیەک بگرێت و سەجدەی بۆ ببات بێجگه له الله، شەیطان وای له كەسیان نەكردووه بیپەرستن یان سەجدەی بۆ ببەن، بەڵكو گوێڕایەڵییان كرد لەوەی خوایەكی تر بگرن بێجگه له الله، كاتێک هەموویان كۆدەكرێنەوه له دۆزەخدا شەیطان پێیان دەڵێت ﴿إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِنْ قَبْلُ﴾ [إبراهيم:٢٢]، ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ ۝٩٨﴾ [الأنبياء:٩٨].

عیسا و فریشتەكان پەرستران بێجگه له الله، وه الله دایان نانێت له دۆزەخ، خۆر و مانگ تاوانیان نیه، ئەمه دەگەڕێتەوه بۆ گوێڕایەڵی شەیطان بۆیه دەچێته دۆزەخەوه لەگەڵیاندا، كاتێک لێیان نزیک

دەبێتەوە ﴿تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴿٩٧﴾إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴿٩٨﴾﴾ [الشعراء:٩٧،٩٨].

وە فریشتەکان کاتێک الله پرسیاریان لێ دەکات دەڵێن ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ﴿٤٠﴾قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنْتَ وَلِيُّنَا مِنْ دُونِهِمْ بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ﴿٤١﴾﴾ [سبأ:٤٠،٤١].

دەڵێت: ئایا نابینن پەرستشەکانیان بۆ جنەکان کە گوێڕایەڵییان کردن لە پەرستنی جگە لە الله، پەرستنەکەش بوو بە گوێڕایەڵی.

٥- وە پرسیار دەکات دەربارەی ئیسلام؟

ئیسلام: پاڵفتەبوونە، الله بە ئیبراهیم دەفەرموێت: ﴿أَسْلِمْ﴾ [البقرة:١٣١]، دەفەرموێت: خۆت پاڵفتە بکە.

﴿مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ﴾ [البقرة:١١٢]، دەفەرموێت: هەرکەس دینەکەی پاڵفتە بکات بۆ الله.

٦- پرسیار دەکات دەربارەی پاڵفتەبوون [الإخلاص] ؟

پاڵفتەبوون: بەندە دین و کردارەکانی پاڵفتە بکات بۆ الله، کارەکانی خۆی پیشانی کەس نەدات، وە ئەمە هەمووی لەپێناوی حەقدا بکات، ئەمە پاڵفتەبوونە.